# هەولێر لە بەڵگەنامە عێراقی و بریتانییەکاندا

## ١٩٢٢ - ١٩٥٧

بەرگی یەکەم


ئامادە و پێشکەشکردنی: د. نەوزاد یەحیا باجگر

وەرگێڕانی: د. بورهان حاتەم گۆمەتاڵی - د. هۆشەنگ ساڵح نەجاڕ



بڵاوکراوەی زانکۆی جیهان

خانەی ئەرشیف و بەڵگەنامەکان

٢٠٢٤

- ناوی کتێب: **هەولێر لە بەڵگەنامە عێراقی و بریتانییەکاندا (١٩٢٢-١٩٥٧)**
- ئامادە و پێشکەشکردنی: د. نەوزاد یەحیا سەعید باجگر
- وەرگێڕان (زمان): د. بورهان حاتەم گۆمەتاڵی - د. هۆشەنگ ساڵح نەجاڕ
- دیزاینی بەرگ و ناوەوە: سومەییە مورادی
- بڵاوکراوەی: زانکۆی جیهان ا خانەی ئەرشیف و بەڵگەنامەکان
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپ: یەکەم ٢٠٢٤ هەولێر

ISBN 978-9922-8601-2-1

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارەی سپاردن ( ٢٠٢٤ )ی ساڵی٢٠٢٣ی وەزارەتی رۆشنبیری

# پێرست

# پێشەکی

لە سۆنگەی گرنگی بەڵگەنامەکان، کە یەکێکە لە سەرچاوە هەرە بایەخدارەکانی لێکۆڵینەوەی مێژوویی، کە تەنانەت دەگوترێت «مێژوو بەبێ بەڵگەنامە نانووسرێتەوە»، زانکۆی جیهان وەك یەکێك لە دەزگا زانستییەکان، لە درێژەی بایەخدانەکانی بە بابەتی وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی بەڵگەنامەکانی تایبەت بە ناوچەکانی کوردستان، کتێبی (هەولێر لە بەڵگەنامە عێڕاقی و بریتانییەکاندا ١٩٢٢-١٩٥٧) دەخاتە بەردەستی خوێنەران و توێژەران.

ئەم کتێبە، وەرگێڕانی کۆمەڵێك بەڵگەنامەی بڵاونەکراوەی گرنگی عێراقی و بریتانین، لەبارەی هەولێر لە ماوەی پاشایەتییدا، کە دەقی بەڵگەنامەکە و وەرگێڕانەکەی بەرامبەر یەک دانراون. کتێبەکە لە دوو بەش پێکهاتووە، لە بەشی یەکەمدا بارودۆخی کارگێڕی و دارایی و ڕۆشنبیری و شارەوانی هەولێر لەمیانەی بەڵگەنامەکانی حکوومەتی عێڕاقییدا خراوەتەڕوو. بەڵگەنامەکان زانیاری وردیان دەربارەی سەرەتاکانی دروستبوونی یەکە کارگێڕییەکانی لیوای هەولێر و بودجەی لیواکە و داهات و خەرجییەکان و شارەوانی و دروستکردنی بنکەکانی پۆلیس تێدایە. هەروەها چەندین بەڵگەنامەی تایبەت بە دامەزراندن و چالاکییەکانی یانەکانی وەك (یانەی فەرمانبەران و یانەی پارێزەران و یانەی عەنکاوە)ی نێو شاری هەولێر تێدا بڵاوکراوەتەوە، ئەمەش دەرخەری لایەنێکی پڕشنگداری ڕۆشنبیریی شارەکەیە لەو ماوەیەدا.

بەشی دووەمی کتێبەکە تایبەتە بە هەولێر لە بەڵگەنامە بریتانییەکاندا. لەم بەشەدا بەشێوەیەکی گشتی بارودۆخی سیاسی و سەربازی و هۆزایەتی هەولێر لەماوەی بیستەکانی سەدەی ڕابـردوودا، بەگوێرەی ڕاپۆرت و نووسراوە نهێنییەکانی بریتانیا دەردەکەوێت. بەڵگەنامەکانی ئەم بەشەش، زانیاریی هەستیاریان لەبارەی هۆز و کەسایەتییە کوردییەکان و چالاکییە سەربازییەکانی هێزە ئاسمانییەکانی بریتانیا لە بەرامبەر ناوچەکانی لیوای هەولێر و جووڵانەوەکانی شێخ ئەحمەدی بارزان و سمکۆی شکاك لەخۆگرتووە. لە کۆتاییدا هیوادارین ئەم بەرهەمە کەلێنێك لە کتێبخانەی کوردییدا پڕ بکاتەوە و ببێتە مایەی سوود گەیاندن بە خوێنەران و توێژەران.

د. نـەوزاد یـەحـیا باجـگر
سـەرۆکی دەسـتەی ئـەمیـنداریـەتی زانـکۆکانی جیهان

# پێشەکی وەرگێڕەکان

بەڵگەنامە بە سەرچاوەیەکی گرنگی لێکۆڵینەوەی مێژوویی دادەندرێت، بەتایبەت ئەو بەڵگەنامانەی لە شێوەی نووسراو یان نامەی تایبەت، بە نهێنی لە نێوان دامودەزگا فەرمییەکان، یان لە نێوان کەسانێکی پەیوەست بە ڕووداوێک، ئاڵوگۆڕییان پێکراوە، گرنگییەکەی زیاتر لەوەدایە، کە هەوڵدراوە بۆ کەڵکوەرگرتن لە زانیارییەکانی ناوی، بە شێوەیەکی ڕاست و دروست، بخرێنە ڕوو، بەتایبەت ئەو نووسراوانەی کە دەزگا هەواڵگرییەکان، بە مەبەستی ئامانجی سیاسی، یان هەر جۆرە ئامانجێکی دیکە، کاریان لەسەر کردووە، ئەگەرچی ئەوە بەو مانایە نایەت، کە توێژەر بەبێ لێکۆڵینەوە، پشتیان پێ ببەستێت و زانیارییەکان بەبێ هیچ گومانبردنێك بخاتەڕوو، بەڵام هەوڵدان بۆ دەستخستنیان و کارلەسەرکردنیان ئەرکێکی زانستییانەی پڕ لە بایەخی توێژەرانی بواری مێژووە.

ئەم بەڵگەنامانەی لێرەدا خراونەتە ڕوو، زۆربەیان لە خانەی کتێب و بەڵگەنامەی نیشتمانیی (دار الكتب والوثائق الوطنية) لە بەغداد پارێزراون، دۆسیەی جۆراجۆریان لە بووارە جیاوازەکانی کاروباری وڵاتی عێراق بە کوردستانیشەوە لە خۆگرتووە، وەک دۆسیەی تایبەت بە بوواری سیاسی، کارگێڕی، ئابووری، پەروەردەیی و بووارەکانی دیکە. هەریەك لەم دۆسیانە، دەیان بەڵگەنامەی لە شێوەی نووسراوی فەرمی، کۆنووس، ڕاپۆرت، فەرمانی دەوڵەتی لەخۆ گرتووە و زانیاری گرنگیان بەدەستەوە داوە، کە ڕەنگە ئەو زانیارییانە لە توێی بڵاوکراوە فەرمی و گۆڤار و ڕۆژنامەکانی حکوومەت بەو وردەکارییەوە نەخرابنە ڕوو.

ئەوەی لە توێی ئەم پەرتووکەدا خراوەتە ڕوو، مەڵۆیەکە لە خەرمانی ئەو بەڵگەنامانە، کە تایبەتە بە لیوای هەولێری سەردەمی پاشایەتی، کە زیاتر لە ساڵی ١٩٢٢ەوە دەست پێ دەکەن، ئەمەش لە کاتێکدایە، کە هەولێر لەمێژنەبوو لە قەزایەکی فەرامۆشکراوی دەوڵەتی عوسمانییەوە، ببووە ناوەندی لیوایەکی کارگێڕیی گرنگی دەوڵەتی تازەدروستبووی عێراق. کە وردە وردە دامودەزگاکانی کارگێڕیێتی لیوای تێدا دروست دەکرا و کاروبارەکانی بەهۆی بودجەیەکی تایبەتەوە، ڕایی دەکرا.

ئەوسا ناوەندی قەزای هەولێر و سنووری لیواکەی ئەوەها فراوان نەبوو، هەولێری ساڵانی بیستەکان لە قەڵات و چەند گەڕەکێکی بچووکی دەوروبەری پێکدەهات. کە زۆربەی خانووەکانی لە قوڕ کەرپووچ دروستکرابوون، بازاڕێکی بچکۆڵانە، کە ئەویش هەر کەوتبووە دامێنی قەڵات، دەیتوانی پێداویستی سەرجەم دانیشتووانی شارەکە دابین بکات، ژمارەیەکی کەمی چێشتخانە و قاوەخانە و گەرماو و مزگەوت و حوجرە و قوتابخانە، بۆ خەڵکی شارەکە بەس بوون، ئەمە وێڕای بوونی هەندێك کارخانەی بچووك، کە نەك پێداویستی خەڵکی ناوشار، بەڵکو گوندەکانی دەوروبەریشیان دابین دەکرد.

دوای ئەوەی شارەکە کرایە ناوەندی لیوای هەولێر، سەرەتا کاروبارەکانی هەر لەو بینایانە بەڕێوە دەبران، کە لە سەردەمی عوسمانی دروستکرابوون، کە ژمارەیان لە پەنجەکانی دەست کەمتر بوون، ئەوانیش وەك سەرای هەولێر، قشلە، بەندیخانە و قوتابخانە. هەریەك لەوانەش چەند کارمەندێکی دیاریکراو یان ئەنجوومەنێکی جێبەجێکار بەڕێوەیان دەبرد، وەك ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێر، کە هەر لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمەوە دروست ببوو، ئەمانەش وەك لە ناوەرۆکی ئەو بەڵگەنامانە دەردەکەوێت، لە کێشە و کەموکوڕی بەدەرنەبوون، بۆیە دواتر حکوومەتی عێراقی بە پاڵپشتی مانداتی بریتانی، هەوڵیاندا هەندێك گۆڕانکاری لەو شارە بێننەکایەوە.

بەڵگەنامەکانی بەشی یەکەمی نێو ئەم کتێبە، وێنایەکی گشتی هەولێری سەردەمی پاشایەتیمان، بەتایبەت لە بوواری کارگێڕی و دارایی، بۆ دەکات، لەتەك ئەمەدا، هەندێك زانیاری تایبەت بە دامەزراندنی چەند یانەیەکی هەولێری ئەو قۆناغەمان بۆ دەخەنە ڕوو، وەك (یانەی فەرمانبەران و یانەی پارێزەران و یانەی عەنکاوە)، کە هەوڵەکان لەبارەیەوە چۆن بوونە و ئەنجامەکەی چی بووە؟

بەشی دووەمی بەڵگەنامەکان، کە ئەوانیش هەر لە خانەی کتێب و بەڵگەنامەی نیشتمانیی بەغداد پارێزراون، نووسراو و ڕاپۆرتە هەواڵگرییەکانی بریتانیای تایبەت بە سنووری لیوای هەولێرن, کە کاتی خۆی لەلایەن خانەی ناوبراو بۆ سەر زمانی عەرەبی وەرگێڕدراون. ئەم بەڵگەنامانە زیاتر زانیارییان لەبارەی پێشهاتە سیاسییەکانی سنووری لیوای هەولێری ساڵانی بیستەکان لە خۆگرتووە، بەتایبەتی زانیاری لەبارەی عەشیرەت و کەسایەتییە کوردییەکان و کردە سەربازی و جووڵەی هێزە ئاسمانییەکانی بریتانیا لەو ناوچەیەدا. هەروەها چەندین بەڵگەنامەی تایبەت بە هەردوو جوڵانەوەی شێخ ئەحمەدی بارزان و سمکۆی شکاك لە سنووری لیوای هەولێر خراونەتەڕوو، بەپێی ئەم بەڵگەنامانە دەردەکەوێت، کە ئەم جووڵانەوانە چەندە جێی بایەخی دەوڵەتی کۆڵۆنیالی بەریتانیا بووە لە عێراقدا.

ئەوەی وەك ڕێباز لەم پەرتووکەدا پەیڕەو کراوە، دانانی بەڵگەنامەکانە لە شێوەی دۆسیەی تایبەت بەو بووارە جیاوازانەی، کە ئەم بەڵگەنامانە بایەخیان پێداوە، وەك دۆسیەی تایبەت بە داهات و خەرجی و بودجە و شارەوانی هەولێر، یانەکانی هەولێر، بەندیخانەی هەولێر، پاشان هاتووەتە سەر بەڵگەنامە بریتانییەکان، لەوێشدا چەند دۆسیەیەکی وەك هەولێر لە ڕاپۆرتە هەواڵگرییەکانی بریتانیا و سمکۆی شکاك و شێخ ئەحمەدی بارزان و ئەوانیدیکەی دروست کردووە، هەر بەڵگەنامەیەکیش کە ناوەرۆکەکەی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی، لەگەڵییدا وێنەی ئۆرگیناڵی بەڵگەنامەکەش خراوەتە ڕوو. ئەمەش بۆ ئەوەیە تاوەکوو توێژەران و خوێنەران جگە لە وەرگێڕانەکە، وێنەی ڕەسەنی بەڵگەنامەکەش ببینن. پاشان هەر بەڵگەنامەیەك ژمارەیەکی تایبەتی بەپێی دۆسییەکە بۆ داندراوە، ئەمەش جارێکی دیکە بۆ کارئاسانی توێژەران داندراوە، تا بە ئاسانی دەستیان پێ بگات.

وەرگێڕانی بەڵگەنامە، کارێکی هەروا ئاسان نییە، ماندووبوون و لێوردبوونەوە و شەونخوونی زۆری پێویستە، بەشبەحاڵی ئەو بەڵگەنامانە، لەم ماندووبوونە بەدەر نەبوونە، سەرەتا لە نێو سەدان بەڵگەنامە، گرنگترینیان هەڵبژێردراون، پاشان بەپێی بابەتەکان پۆلێنکراون، ئەوانەی کە بە گرنگ نەزاندراون، وەلا نراون، پاشان کاری وەرگێڕانیان بۆ کراوە، بەپێی ساڵ و ڕێککەوتی دەرچوونی بەڵگەنامەکە پۆلێنکراون. خودی وەرگێڕانەکە بێ گرفت نەبووە، بەڵگەنامەکان زۆربەیان بە ئامێری ڕۆنیۆ چاپ کراون، دەیان دانەی تێدایە، کە ڕستەکانی ناوی لێڵ و ناڕوونن، خوێندنەوەی تەنها وشەیەك کاتێکی زۆری ویستووە تا ساخ کراوەتەوە، مەبەستی چیە.

ئەمە لەکاتێکدایە کە وەرگێڕانەکان، وەرگێڕانی وشە بە وشە نین، بەڵکو هەوڵدراوە واتا گشتی و مەبەستی بەڵگەنامەکە وەربگێڕدرێت، کە دواجار ئەمە دەبێتە کەرەستەی سوودبینینی توێژەران و خوێنەرانی کورد.

لە کۆتاییدا جێگەی خۆیەتی سوپاسێکی بێپایانی بەڕێز (د. نەوزاد یەحیا باجگر) سەرۆکی دەستەی ئەمینداریيەتی زانکۆکانی جیهان بکەین بۆ بەدەمەوەچوونی ئەم پڕۆژەیە، وەك چۆن لە ڕابردوودا هەنگاوی گرنگی لەمبارەیەوە ناوە. ماوەتەوە بڵێین، کە ئێمە لەم پەرتووکەدا بانگەشەی کارێکی تەواو باش و بێ کەموکوڕی ناکەین، بۆیە هەر سەرنج و تێبینیێکی خوێنەران، ئەو کەلێن و درزانە ڕۆشن دەکەنەوە، کە ئێمە پەیمان پێ نەبردوون و لە چاپەکانی داهاتوودا سوودیان لێ دەبینین.

د.بورهان حاتەم گۆمەتاڵی- د.هۆشەنگ ساڵح نەجاڕ

هەولێر

٢٠٢٣/٩/١



مفتشية الشرطة العامة
الرقم ٨٣٣٤
بغداد في ٣١ تموز ١٩٢٢

No. 13/8
OFFICE OF INSPECTOR GENERAL OF POLICE,
I R A Q
BAGHDAD THE 31st July 1922.

To
The Ministry of Interior,
Baghdad.

معالي وزير الداخلية الأفخم

CHARGES:

I enclose herewith Command Paymaster's No. Rec/Lab/Rev.42, my No.7523/13/8 and Commandant of Police Erbil's No.268-A-27 dated 30th June 1922, 5th July 1922 and 15th July 1922 respectively.

It is presumed that the charge is to be borne by the Civil Jail if so, will you please direct the Inspector of Civil Jails to pay the sum of Rs. 1025/2/- to the Command Paymaster under advice to this office.

بعد التحية · تجدون طيه كتاب محاسب الخزينة العسكرية رقم ٤٢ وكتابي رقم ٧٥٢٣/١٣/٨ وكتاب مدير شرطة اربيل رقم ٢٦٨ ا ب ٢٧ المؤرخين بتاريخ ٣٠ حزيران ١٩٢٢ و ٦ تموز ١٩٢٢ و ١٥ تموز ١٩٢٢ تبعا ·

المظنون ان هذه المصاريف يجب ان يتحملها السجن الملكي فاذا كان ذلك فالرجاء ان تشعروا مفتش السجون الملكية لدفع مبلغ ١٠٢٥ روبية و ٢ آنة الى محاسب الخزينة العسكرية باستشارة دائرتنا ·

Lt. Col., I.A.
INSPECTOR GENERAL OF POLICE
I R A Q.

مفتش الشرطة العام
في العراق

| دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٢-١٩٢٤/ بەڵگەنامەی ژمارە (١) |
| --- |
| وەزیری ناوخۆی بەڕێز<br>پشکنەری گشتی پۆلیس<br>ژمارە: ٨٣٣٤<br>ڕێککەوت: ٣١ی تەمموزی ١٩٢٢<br>وەزیری ناوخۆی بەڕێز<br>پاش سڵاو.<br>نووسراوی ژمێریاری گەنجینەی گشتی بە ژمارە ٤٣ و ٨/٧٥٢٣ و نووسراوی بەڕێوەبەری پۆلیسی هەولێر ژمارە ٢٧-١-٢٦٨ لە ڕێککەوتی ٣٠ی حوزەیران و ٦ی تەمموزی ١٩٢٦ مان پێگەیشت. سەبارەت بەو خەرجییانەی، کە پێویستە بەندیخانەی پاشایەتی بیدات، تکایە پشکنەری بەندیخانەی شاهانە ئاگادار بکەنەوە، بە پێدانی ١٠٣٥ ڕوپیە و ٢ عانە بە ژمێریاری گەنجینەی گشتی، بە ڕاوێژ لەگەڵ فەرمانگەکەمان.<br><br>پشکنەری گشتی پۆلیس لە عێراق |



32050/392

No. 37 Office of the Divisional Adviser,
Arbil, dated 29th January 1923.

To,

The Ministry of Interior,

BAGHDAD.

Memorandum.

Rf: your No.1134 dated 18/1/1923.

Herewith one copy each in English and Arabic of Budget Estimates for the year 1923-24 of Arbil Sub-Liwa pertaining to your Ministry.

In the Column Budget Estimates for 1922-23 in Budget Form 3, only total expenditure for the year has been shown as the Budget Estimates were consolidated

2463
3/2/23.

For Captain,
Offg: Divisional Adviser, Arbil.

Copy to :-
Mutasarif, Kirkuk, for information.

TA
3/2

**دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٢-١٩٢٤/ بەڵگەنامەی ژمارە (٢)**

نووسینگەی ڕاوێژکاریی لیوای هەولێر
ڕێککەوتی ٢٤ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٣.
بۆ وەزارەتی ناوخۆ/ بەغداد

یاداشت:
ژمارە ١١٣٤ لە ڕێکەوتی ١٩٢٣/١/١٨.
بۆ ئێرە دانەیەک کۆپی بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی، لە خەمڵاندنی بودجە بۆ ساڵی ١٩٢٣-١٩٢٤ی لیوای هەولێر. تایبەت بە وەزارەتەکەتان. خەمڵاندنی بودجەی ستوونی بۆ ساڵی ١٩٢٢-١٩٢٣ لە فۆرمی بودجەی ٣، تەنها کۆی خەرجییەکانی ساڵەکە نیشان دراوە وەک ئەوەی خەمڵاندنی بودجە یەک خرابێت.
Fn کاپتن
ڕاوێژکاری هۆبەی هەولێر
دانەیەک بۆ موتەسەریفی کەرکووک بۆ زانیاری


32050/392

BUDGET FORM I - 1923-24.

| | |
|---|---|
| Name of Ministry, Department or Liwa: | ARBIL. |
| Total Revenue estimated : | Rs. ~~5,41,176.~~ 6,11,176 |
| Total Expenditure estimated: (Revenue & Treasuries) | Rs. ~~1,49,264.~~ 1,50,928 |
| - do - (General Administration) | " ~~1,61,316.~~ 151631 |

Certified that all necessary details in support of the estimates are included in the attached budget statements and forms as required by the "Instructions for the preparation of the annual estimates", and that the estimates of revenue and expenditure represent, as far as can be foreseen, a reasonable approximation to the actual revenue which will be collected, and expenditure which will be incurred, during the course of the financial year.

Dated the 28 January '23.

Naib Mutasarrif,
ARBIL.

COUNTERSIGNED.

Dated the '23. Minister

**دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٢-١٩٢٤/ بەڵگەنامەی ژمارە (٣)**

نووسینگەی ڕاوێژکاریی لیوای هەولێر
لیستی بودجەی ١٩٢٣-١٩٢٤
لیوای هەولێر
خەمڵاندنی کۆی گشتی داهات

پشتڕاستی دەکەینەوە، کە هەموو وردەکارییەکی پێویست، بۆ خەمڵاندنی داهات، لە بەیاننامە و فۆرمەکانی بودجەی هاوپێچدا هاتووە. وەک لە ڕێنماییەکانی ئامادەکردنی خەمڵاندنی ساڵانەدا هاتووە «خەمڵاندنی داهات و خەرجییەکان، کاریان لەسەر دەکرێت، تا ئەو جێگایەی دەتوانرێت پێشبینی نزیکبوونەوە لە کۆکردنەوەی داهاتی ڕاستەقینە و خەرجییەکان، لە ماوەی ساڵێکی داراییدا، بکرێت.

موتەسەریفی هەولێر

٢٨ی کانوونی دووەمی ١٩٢٣



١٥٨٧

١١ تشرين الاول ١٩٢٣

لسعادة متصرف لواء اربيل المحترم

بعد التحية .

عطفا على كتابكم المرسل لوزارة المالية الجليلة المرقم ١٦٣٣ والمورخ في ٦ سبتمبر ١٩٢٣ والمودوع لهذه الوزارة .

الرجاء ان تعرفونا عن نوع وجنس ماترغبون شراءه من الاثاث لكل قضاء وناحية وشعبة كما محرر في القائمة المرفقة في كتابكم المنوه عنه اعلاه . ولكم منا الاحترام .

وكيل وزير الداخلية

١٠١

| دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٢-١٩٢٤/ بەڵگەنامەی ژمارە (٤) |
| --- |
| ١١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٣<br>بۆ جەنابی موتەسەریفی لیوای هەولێری بەڕێز<br><br>دوای سڵاو،<br>ئاماژە بە نووسراوتان کە بە ژمارە ١٦٣٣ لە ڕێککەوتی ٦ی ئەیلوولی ١٩٢٣ بۆ وەزارەتی داراییتان ناردووە. تکایە ئاگاداری جۆر و ڕەگەزی ئەو کەلوپەلانەمان بۆ بکەنەوە، کە بۆ هەر قەزا و ناحیە و هۆبەیەک دەکرڕێت، وەک لە لیستی هاوپێچدا لە نووسراوەکەتاندا ئاماژەی پێکراوە.<br>لەگەڵ ڕێزدا<br><br>بریکاری وەزیری ناوخۆ |


دائرة متصرف لواء اربيل
العدد /١٩/ ٣١٠١
تاريخ ٣ نوفمبر/١٩٢٣ .

صاحب المعالي وزير المالية الجليلة الافخم .
بغداد .

تبجيلا واحتراما .
وبعد الرجاء ان تصادقوا على صرف المبلغ ١١٦ روبية المحرر في القائمة المربوطة طيه وذلك قيمة المفروشات المحرر بالقائمة المذكورة اللازمة لشعبة جناران . هذا ولمعاليكم مزيد الاحترام .

عن متصرف لــواء اربيل

NOV 13 23

المرفقات ــ ١

## دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٢-١٩٢٤/بەڵگەنامەی ژمارە (٥)

فەرمانگەی موتەسەڕیفییەتی لیوای هەولێر
ژمارە/ ١٩/ ٣١٠١
ڕێککەوت/ ٣/ نۆڤێمبەر/ ١٩٢٣
بۆ/ بەڕێز وەزیری دارایی/ بەغداد
ڕێز و سڵاو..
تکایە ڕەزامەندی بفەرموون لەسەر خەرجکردنی بڕی ١١٦ ڕوپیە، کە هاوپێچ لە لیستی پەیوەستکراودا نووسراوە. ئەمەش نرخی ئەو ڕایەخانەی هۆبەی چنارانە، کە لە لیستی ناوبراودا باسکراوە. لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزدا.

ئیمزا
موتەسەڕیفی لیوای هەولێر

هاوپێچەکان-١



دائرة متصرف لواء اربيل
المحاسبة
عدد
تاريخ ٢٤ تشرين اول/ ٩٢٣

صاحب المعالي وزير الداخلية الافخم
بغداد .

تبجيلا واحتراما .
وجوابا لكتاب معاليكم المؤرخ ١١ تشرين اول/ ٢٣ والمرقم بعدد ١٥٨٧٢ . نقدم لمعاليكم طيه اربعة قوائم تبين نوع وجنس الاشياء التي نرغب شرائها لكل قضاء وناحية . هذا ولمعاليكم وافر الاحترام .

متصرف لواء اربيل

المخطوطات
٤ قوائم

## دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٢-١٩٢٤/ بەڵگەنامەی ژمارە (٦)

فەرمانگەی لیوای هەولێر
ژمێریاری
ڕێککەوت: ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣
جەنابی وەزیری ناوخۆ/ بەغداد

سڵاو و ڕێز
بۆ وەڵامدانەوەی نوسراوی بەڕێزتان لە ڕێککەوتی ١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣ بە ژمارە ١٥٨٧٢. ئێمە چوار لیست دەخەینە بەردەم بەڕێزتان, کە جۆر و ڕەگەزی ئەو کەلوپەلانەی تێدا دیارکراوە، کە ئارەزووی کڕینیان دەکەین بۆ هەر قەزا و ناحیەیەک. لەگەڵ ڕێزدا.

موتەسەریفی لیوای هەولێر



32050/392

97

MINISTRY OF FINANCE
16493
DATE 25/10/23

دائرة متصرف لواء اربيل
عدد ٩٩/٢٠٧٢
تاريخ ١٧ تشرين اول/ ٩٢٣

الى معالي وزارة المالية الجليلة بغداد

تبجيلا وتوقيرا .
وبعد الرجاء ان تصدقوا على صرف المبلغ ٩١٩/٥ روبية المذكورة بكتابنا عدد ١٦٣٢/١٩ بتاريخ ٦ سبتمبر/ ٩٢٣ . وذلك اثمان المفروشات للواء اربيل . هذا ولمعاليكم مزيد الاحترام .

متصرف لواء اربيل

From Mutasarrif Arbil asking for sanction for the payment of Rs 919/5 mentioned in his letter No. 1632 of 6th Sept. 1923.
17-10.

OCT 24 23

| دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٢-١٩٢٤/ بەڵگەنامەی ژمارە (٧) |
| --- |
| فەرمانگەی موتەسەڕیفییەتی لیوای هەولێر<br>ژمارە/ ٢٠٧٢/ ٩٩<br>ڕێککەوت/ ١٧/ تشرینی یەکەم/ ١٩٢٣<br>بۆ/ بەڕێز وەزیری دارایی/ بەغداد<br>ڕێز و سڵاو..<br>تکایە ڕەزامەندی بفەرموون لەسەر خەرجکردنی بڕی ٥/ ٩١٩ ڕوپیە، کە لە نووسراومان ژمارە ١٦٣٢/ ١٩ لە ڕێککەوتی ٦ی سێپتێمبەری ١٩٢٣ دا باسکراوە. ئەمەش نرخی ڕایەخەکانی لیوای هەولێرە. لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزدا.<br><br>ئیمزا<br>موتەسەڕیفی لیوای هەولێر |



العدد ——

وزارة داخلية العراق
بغداد ٧ تشرين الثاني ١٩٢٣

الى سعادة كافة المتصرفين الكرام .

بعد الاحترام . وبالاشارة الى منشور وزارة المالية المرقم ١١٠٣٥ والمؤرخ في ٢٣/١١ الموجه الى كافة الوزارات مع صورة منه اليكم .

فان التقديرات المنقحة لادارة لوائكم العامة سنة ٢٣ ـ ٢٤ يجب ان تقدم الى وزارة المالية مباشرة على ان ترسل الى هذه الوزارة صورة منها للحفظ . ولكم الاحترام .

عن وكيل وزير الداخلية

صورة الى وزارة المالية الجليلة للمعلومات .

No.M.I/ 17368

MINISTRY OF INTERIOR
'IRAQ

BAGHDAD, the 7th November, 1923.

To,

The Mutasarrif, Baghdad
" Mosul
" Basra
" 'Amara
" Hilla
" Nasiriya
" Karbala
" Kut
" Ba'quba
" Ramadi
" Kirkuk
" Diwaniya
" Arbil.

MEMORANDUM.

Reference Ministry of Finance's circular memo No.11305 dated 5.11.1923 addressed to all Ministries with a copy to you.

The revised estimate of General Administration of your liwa for the year 1923-24 should be submitted to Ministry of Finance direct with a copy to this Ministry for record.

for ACTING MINISTER OF INTERIOR.

Copy to:-

Ministry of Finance, Baghdad, for information.

**دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٢-١٩٢٤/ بەڵگەنامەی ژمارە (٨)**

وەزارەتی ناوخۆی عێراق
بەغداد-٧ی تشرینی دووەمی ١٩٢٣

بەڕێز/ سەرجەم موتەسەریفانی بەڕێز

دوای سڵاو.
بە ئاماژەدان بە بڵاوکراوەی وەزارەتی دارایی، ژمارە ١١٠٣٥، لە ڕێککەوتی ٢٣/١١، کە ئاراستەی سەرجەم وەزارەتەکان و ئێوە کراوە.
خەمڵاندنەکان، بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری لیواکان بۆ ساڵی ١٩٢٣-١٩٢٤ بەردەستە، کە دەبێت ڕاستەوخۆ پێشکەشی وەزارەتی دارایی بکرێت بەمەرجێک کۆپییەک بپارێزرێت. لەگەڵ ڕێزدا.

لەجیاتی/ وەزیری ناوخۆ

وێنەیەک بۆ وەزارەتی دارایی شکۆدار بۆ زانیاری


To

الى :

No.

Dated the 192

Memorandum

**دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٢-١٩٢٤/ بەڵگەنامەی ژمارە (٩)**

موتەسەریفییەتی لیوای هەولێر
ژمارە: ٦٨٤/٢
ڕێککەوت: ١٩٢٣/١٠/٣٠

بەڕێز جەنابی وەزیری ناوخۆی بەڕێز/ بەغداد

لە وەڵامی فەرمانی شاهانەییتان، ژمارە ١٥٨٧٠ لە ڕێککەوتی ١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣. فەرمانی ژمارە ٩٤١ لە ڕێککەوتی ٧ ی تەمموزی ١٩٢٣مان پێنەگەیشت، بۆ پێشکەشکردنی پێشنیارەکانمان، بۆیە تکایە فەرمان بکەن کە کۆپییەکی بۆمان بنێرن، ڕێز و سڵاو.

موتەسەریفی لیوای هەولێر



١٨٣٤٩

٢٦ تشرين الثاني ١٩٢٣

لسعادة متصرف لواء اربيل المحترم .

جوابا لكتابكم المرقم ٣١٠١ والمؤرخ ١٩٢٣/١١/٣ .

بما ان الرصيد الذي في ميزانية لوائكم لمادة ٣ المفروشات نفد فمن اى مادة تقترحون اجراء مناقلة هذا المبلغ .

ولكم منا الاحترام .

وكيل وزير الداخلية .

**دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٢-١٩٢٤/ بەڵگەنامەی ژمارە (١٠)**

ژمارە/ ١٨٣٤٩

ڕێککەوت/ ٢٦/ تشرینی دووەم/ ١٩٢٣

بۆ/ بەڕێز موتەسەڕیفی لیوای هەولێر

ڕێز و سڵاو..

وەڵامی نووسراوتان ژمارە ٣١٠١ لە ڕێککەوتی ٢٠٢٣/١١/٣.

هەرچەندە ئەو بڕە تەرخانکراوەی، کە لە بودجەی لیواکەتان لە ماددەی ٣ی ڕایەخ تەواو بووە، پێشنیار دەکەن لە چ ماددەیەك ئەو بڕە پارەیە بگوازرێتەوە؟ لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزدا.

ئیمزا

بریکاری وەزیری ناوخۆ

هاوپێچەکان-١



'IRAQ,
MINISTRY OF FINANCE.
BAGHDAD.

No. ......M.F.......... عدد
Date 24 November 1923. تاريخ

العراق
وزارة المالية
بغداد

To:-
The Ministry of Interior,
Baghdad.

الى وزارة الداخلية الجليلة

Memorandum:
I forward herewith in original Mutasarrif Arbil's letter No.3101/19 dated 3-11-1923, for favour of disposal. The letter should have been addressed to you direct.

نرسل لكم في طيه اصلا كتاب متصرف لواء اربيل رقم ٣١٠١ بتاريخ ١٩٢٣/١١/٣ لاجل التفضل باجراء اللازم وكان يجب ارساله لكم راسا .
واقبلوا احترامنا .

for MINISTER of FINANCE.

عن وزير المالية .

Copy to:-
Mutasarrif Arbil.

يرسل صورة الى :-
سعادة متصرف لواء اربيل
المحترم .

S.A.

ع · س ·

| دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ۱۹۲۲-۱۹۲٤/ بەڵگەنامەی ژمارە (۱۱) |
|---|

عێراق
وەزارەتی دارایی
ژمارە: ١١٩٢٦
ڕێککەوت: ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٩٢٣

بۆ وەزارەتی ناوخۆی شکۆدار

نووسراوی موتەسەریفییەتی لیوای هەولێرتان بە ژمارە ٣١٠١ لە مێژووی ١٩٢٣/١١/٣ بۆ ڕەوانە دەکەین، بفەرموون بۆ ئەنجامدانی ڕێوشوێنی پێویست و بە زووترین کات ڕەوانەی بکەن.

لەجیاتی/ وەزیری دارایی

وێنەیەک بۆ:
بەڕێز جەنابی موتەسەریفی لیوای هەولێر


دائرة متصرف لواء اربيل

No. ٢٠/٣٣٥٤ نمرة

الى: صاحب المعالي وزير الداخلية الفخم

بغداد .

التاريخ ٣/ كانون اول/ ٩٢٣ الموافق

مذكرة

تبجيلا واحتراما .

وجوابا لكتاب معاليكم المرقم ١٨٣٤٩

والمؤرخ ٢٦ تشرين الثاني/ ٩٢٣ .

ابدي ان المبلغ ١١٦/٠ روبية ينبغي

اجراء مناقلته من المادة ١٣ (المتفرقة) الى المادة (٣ الاثاث

والمهمات) . هذا ولمعاليكم مزيد التحية والاحترام !

متصرف لواء اربيل

| **دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٢-١٩٢٤/ بەڵگەنامەی ژمارە (١٢)** |
| --- |
| فەرمانگەی موتەسەڕیفییەتی لیوای هەولێر<br>ژمارە/ ٣٣٥٤/ ٢٠<br>ڕێککەوت/ ٣/ کانوونی یەکەم/ ١٩٢٣<br>بۆ/ خاوەن پایە بەڕێز وەزیری دارایی/ بەغداد<br>ڕێز و سڵاو..<br>وەڵامدانەوەی نووسراوی بەڕێزتان ژمارە ١٨٣٤٩ لە ڕێککەوتی ٢٦ی تشرینی دووەمی ١٩٢٣. پێویستە بڕی ١١٦ ڕوپیە لە ماددەی ١٣ (موتەفەریقە) بگوازرێتەوە بۆ ماددەی ٣ (کەلوپەل و شتە بایەخدارەکان). لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزدا.<br><br>ئیمزا<br>موتەسەڕیفی لیوای هەولێر |



No. 16/14

OFFICE OF THE DIRECTOR OF CIVIL
JAILS IN 'IRAQ,
BAGHDAD, 10th. April 1923.

OFFICE ORDER.

On transfer of the Jail at arbil from the Police Department to the Jail Directorate, Feizi Eff: Sulaimani i/c of the said Jail has been taken on the strength of this Directorate and appointed Mamur, District Jail, Arbil on his present pay viz. Rs110/- p.m. with effect from 1st. April 1923.

رقم ٥٠٦/١٤
دائـــرة مدير السجون الملكية العراقية
بغداد في ١٠ نيسان ١٩٢٣

امـــر ادارة

عند احالة سجن اربيل من ادارة الشرطة لمديرية السجون الملكية لفيضي افندي سليمان الذي كان مسئولا عن السجن المذكور قبل على قوة الموظفين لهذه الادارة وعين مأمورا للسجن المشار اليه على راتبه الحالي الذي قدره مائة وعشرة روبيات شهريا اعتبارا من ١ نيسان ١٩٢٣ .

Director,
Of Civil Jails in 'Iraq.

مدير السجون الملكية العراقية
بغداد

Copy to:-
The Ministry of Interior
" First Inspector of Civil Jails in 'Iraq, Baghdad
" The Mutasarrif, Arbil Liwa.
" Muhassib, Arbil Liwa
" Supdt., Central Jail, Mosul
" Mamur, District Jail, Arbil.

صورة الى
فخامة وزارة الداخلية الجليلة ببغداد
" " حضرة اول مفتش للسجون
" " سعادة متصرف لواء اربيل المحترم
" " حضرة محاسب لواء اربيل
" " مدير سجن الموصل
" " مأمور سجن اربيل المحترم

## دۆسیەی پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ١٩٢٣-١٩٤١/ بەڵگەنامەی ژمارە (١)

ژمارە: ٥١٦/١٤
فەرمانگەی بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی پاشایەتی عێراق
بەغداد-١٥ی نیسانی ١٩٢٣

کاتێـک بەندیخانـەی هەولێـر، لـە بەڕێوەبەرایەتـی پۆلیسـەوە بـۆ بەڕێوبەرایەتـی بەندیخانەکانـی پاشـایەتی گواسـترایەوە، فەیـزی ئەفەنـدی سـلێمانی بەرپرسـی ئـەو زیندانە بـوو، کە پێشـتر ئاماژەمان پێـدا و هێزی دەسـتەی ئەم کارگێڕیەتییـەی قبـوڵ کـرد و لەسـەر مووچـەی ئێسـتای, کـە سـەد و دە ڕوپیـە لـە مانگێکدایـە، دامـەزرا. لـە ڕێکەوتـی ١ی نیسـانی ١٩٢٣ەوە بـۆی هەژمـار دەکرێـت.

بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی پادشایەتی لە عێڕاق
وێنەیەک بۆ:
- بەڕێز وەزارەتی ناوخۆ.
- جەنابی پشکنەری یەکەمی بەندیخانە.
- بەڕێز موتەسەریفی لیوای هەولێر.
- ژمێریاری لیوای هەولێر.
- بەڕێوەبەری بەندیخانەی موسڵ.
- بەڕێز سەرپەرشتیاری هەولێر.



دائرة مدير السجون الملكية العراقية
العدد / ١٦٦٧
بغداد ١٧ ايلول ١٩٢٤

١٧٠٥٦
٢٨/٨/٢٤

الى
فخامة وزارة الداخلية الجليلة
بغداد

الموضوع: التصديق على ترقين قيد المحافظ عارف

اقدم طي كتابي هذا صورة تقرير مفتش سجون منطقة الموصل الطالب ترقين قيد المحافظ عارف بن عبد الرحمن من محافظين سجن اربيل لعجزه عن القيام بوظائفه . فالمرجو التلطف بالمصادقة على ترقين قيده .
ولي كل حال الامر لوليه سيدي الفخيم

مدير السجون الملكية العراقية
بغداد

## دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٣-١٩٤١/ بەڵگەنامەی ژمارە (٢)

فەرمانگەی بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانەی پاشایەتی عێراقی
ژمارە: ١٦٦٧
بەغداد. ١٧ی ئەیلوولی ١٩٢٤

بۆ بەڕێز/ وەزارەتی ناوخۆی شکۆدار
بابەت/ ڕەزامەندیدان بۆ لەسەرکارلادانی پاسەوان عارف

ئەم نووسراوەتان بۆ ڕەوانە دەکەین، سەبارەت بە ڕاپۆرتی پشکنەری بەندیخانەکانی ناوچەی موسڵ، دەربارەی لەسەرکارلادانی پاسەوان عارف عەبدولڕەحمان، کە یەکێکە لە پاسەوانەکانی بەندیخانەی هەولێر، بەهۆی بێتوانایی لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی، تکایە ڕەزامەندی بفەرموون بۆ لەسەرکارلادانی.

بەڕێوەبەری بەندیخانەی پاشایەتی عێراقی
بەغداد


دائرة مدير السجون المملكة العراقية
العدد ٧/١٧١٠
بغداد ٢٢ ايلول ١٩٢٤
امر دائرة

عطفا على كتاب مأمور سجن اربيل المرقم ٢٢٢ والمؤرخ ٢٦ آب ١٩٢٤
نصادق على ترقين قيد المحافظ في سجن اربيل عارف بن عبد الرحمن نظرا
لكبر سنه وقلة نظره اعتبارا من يوم وصول هذا الامر وعلى مأمور سجن اربيل
قطع علاقته من السجن وحساب راتبه عن الايام التي يستحقها .

مدير السجون المملكة العراقية

صورة الى .
فخامة وزارة الداخلية الجليلة لعرض المعلومات
سعادة متصرف لواء اربيل المحترم
حضرة مفتش سجون منطقة الموصل المحترم
محاسب لواء اربيل المحترم
مأمور سجن اربيل المحترم

| دۆسیەی کاروباری دارایی لیوای هەولێر ١٩٢٣-١٩٤١/ بەڵگەنامەی ژمارە (٣) |
|---|
| فەرمانگەی بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانەی پاشایەیی عێراقی<br>ژمارە: ١٧١٠/٧<br>بەغداد: ٢٣ی ئەیلوولی ١٩٢٤<br><br>فەرمانی کارگێڕی<br>پاڵپشت بە نووسراوی بەڕێوەبەری بەندیخانەی هەولێر، بە ژمارە ٢٢٢ لە ڕێکەوتی ٢٦ی ئابی ١٩٢٤، ڕەزامەندی دەدەین بۆ لەسەرکارلادانی پاسەوانی بەندیخانەی هەولێر، عارف عەبدولڕەحمان، بەهۆی گەورەیی تەمەنی و کزبوونی ئاستی بینینی، لە ساتی گەیشتنی ئەم فەرمانە، پێویستە بەڕێوەبەری بەندیخانەی هەولێر، پەیوەندی(ناوبراو)بە بەندیخانەوە بپچڕێنێت و مووچەکەشی بەپێی ئەوڕۆژانەی, کە مافی خۆیەتی بۆ هەژمار بکات.<br><br>بەڕێوەبەری بەندیخانەی پاشایەتی عێراقی<br><br>وێنەیەک بۆ:<br>- بەڕێز وەزارەتی ناوخۆی شکۆدار بۆ زانیاری.<br>- جەنابی موتەسەڕیفی لیوای هەولێر.<br>- بەڕێز پشکنەری بەندیخانەکانی ناوچەی موسڵ.<br>- بەڕێز ژمێریاری لیوای هەولێر.<br>- بەڕێز بەڕێوەبەری بەندیخانەی هەولێر. |



**دۆسیەی پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ١٩٢٣-١٩٤١ / بەڵگەنامەی ژمارە (٤)**

ژمارە: ١٧٥٦/٢٠
فەرمانگەی بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی پاشایەتی عێراق
بەغداد-٢٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣
هاوپێچ لەگەڵ بڕیاری فەرمانگەکەمان لە ڕێککەوتی ١٩٢٣/٢١/١٠ی زایینی و ژمارە ١٧٣١:
١. هـۆکاری گواسـتنەوەی فەیـزی ئەفەنـدی، سەرپەرشـتیاری بەندیخانـەی هەولێر، بـە مووچەکەیەوە بۆ نووسـینگەی بەندیخانـەی مووسـڵ، بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کـە ئـەو ڕێنماییانـەی کـە بـۆ بەندیخانەکـە داندرابـوو، پەیـڕەوی لـێ نەکـردووە و زیندانەکـەی بەچاکـی ڕێکنەخسـتووە، لەگـەڵ گەڕانـەوەی پشـکنەر بەڕێـز مارکێـل بـۆ هەولێـر، ڕێنمایـی گرنگـی پێـدا، بۆیـە بەڕێوەبەرایەتـی بەندیخانەکـە ڕازی بـوو بـە گواسـتنەوەی، بـۆ ئـەوەی ڕاهێنانـی پـێ بکرێـت و لە بەندیخانـەی موسـڵ فێـری ئـەو بنەمـا و ڕێککارانـە بکرێـت، کە لـە بەندیخانەکاندا پێویسـتن، بۆ ئـەوەی لـە داهاتوودا پلـەی پێ بـەرز بکرێتـەوە.
٢. هـۆکاری گواسـتنەوەی محەممـەد ئەفەنـدی لـە فەرمانگەی بەندیخانـەی کەرکووکـەوە بۆ فەرمانگـەی بەندیخانەی هەولێـر، ئەوەیـە، کـە پشـکنەر بەڕێـز مارکێـل وای تێبینـی کـردووە، کـە ناوبـراو لـە کاری بەڕێوەبردنـدا سسـتە و بـاوەڕی بەخـۆی نییـە، کاروبارەکانـی ڕادەسـتی فەرمانبـەری بەندیخانـە، فەخـری ئەفەنـدی کـردووە، کـە نووسـەری بەندیخانەیـە، بۆیـە محەممـەد ئەفەنـدی، بـە مەبەسـتی مەشـق و ڕاهێنـان، بانگهێشـتی فەرمانگـەی بەندیخانـەی بەغـداد کـرا و کاتێـک مەشـق و ڕاهێنانەکـەی تـەواو کـرد، بـۆ بەندیخانـەی هەولێـر دەگوازرێتـەوە، تـا ئـەو شـتانەی فێریـان بـووە، جێبەجێیـان بـکات و بـە ئەرکـی خـۆی هەڵبسـتێت.
٣. پاداشـتکردنی فەخـری ئەفەنـدی بەهـۆی هـەوڵ و ماندووبوونەکانـی، هەروەهـا خۆڕاگـری و ڕەوشـتبەرزیمان لـێ بینی .

بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی پاشایەتی عێراق


العدد /
دائرة مديرية السجون الملكية العراقية
بغداد: ٣٠ جنوري ١٩٢٤

سعادة متصرف لواء اربيل المحترم

قد كتب مأمور سجن اربيل كتابا يفهم منه ومن مربوطاته بالقرينة
ان المختارين قد امتنعت من قبول مسئولية محافظة الموقوفات
والشرطة استعذرت عن القيام بمحافظتهن ولذلك ارجو ان تأمروا
من يجد في اربيل امرأة عفيفة ساكنة في بيت مستقل لا يدخل
اليه رجلا وان لا يكن لها ولدا بالغا ايضا [illegible]
ويعاملون تلك المرأة على وضع الموقوفات عندها ويعطى اكلهن
من سجن اربيل ويعطى لها (اي المرأة التي ستحافظ الموقوفات
والمسجونات لمدة قصيرة) يومية عن كل موقوفة او محكومة
لمدة قصيرة من نصف روبية الى ثلاثة ارباع الروبية حسب [illegible]
تدفعها ادارة السجون بشرط ان يؤخذ منها تعهد بالقيام [illegible]
بحافظتهن حسب قانون السجون تحت [illegible] مأمور السجن [illegible]
في اربيل سجن منظم يحتمل به دائرة مخصوصة لحبس النساء هذا
ما اراه موافقا كيلا تتكبد الحكومة مصارفا زائدة . فالمرجو افادتي
عن رأيكم وطالعاتكم بهذا الخصوص ودمتم محترمين.

مدير السجون الملكية العراقية
بغداد

صورة الى:
وزارة الداخلية الجليلة لعرض المعلومات [illegible]
حضرة مأمور سجن اربيل المحترم، اشارة لكتابه المرقم [illegible] ٢٠ كانون الثاني [illegible]

## دۆسیەی پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ١٩٢٣-١٩٤١ / بەڵگەنامەی ژمارە (٥)

فەرمانگەی بەندیخانەکانی پاشایەتیی عێراق
ژمارە: ١٥٤
بەغداد ٣٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٤

بەڕێز جەنابی موتەسەریفی لیوای هەولێر

سەرپەرشتیاری بەندیخانەی هەولێر، بە تێگەیشتنی خۆی و پەیوەندییەکانی بەو بابەتە، نامەیەکی نووسیوە، کە ئەو کەسانەی هەڵبژێردراون ڕەتیانکردووەتەوە بەرپرسیارێتی هێشتنەوەی ئافرەتە دەستگیرکراوەکان قبوڵ بکەن، پۆلیسیش بیانووی جێبەجێکردنی بەرپرسیارێتییەکانی هێناوەتەوە. بۆیە هیوادارین هەرکەسێک ژنێکی پاک و خاوێن لە هەولێر بدۆزێتەوە، کە لە ماڵێکی سەربەخۆدا بژی و مێردی نەبێت و هیچ پیاوێک یان کوڕێکی پێگەیشتوو هاموشۆی ماڵەکەی نەکات. ئەو کەسە، ئافرەتە زیندانی و دەستگیرکراوەکان بۆ ماوەیەکی کەم لای خۆی بهێڵێتەوە و سەرپەرشتییان بکات، کە خواردنیان لە بەندیخانەی هەولێرەوە بۆ دێت. ڕۆژانە بۆ هەریەکێک لە بەندییەکان، نیو تاکوو سێ چارەگ ڕوپیەی پێدەدرێت (بەپێی ئەو بەڵێندەرەی کاروباری بەندیخانە دەگرێتە ئەستۆ)، بەو مەرجەی، بەپێی یاسای بەندیخانە، بەڵێنی پارێزگارییان بدات و لەژێر چاودێری سەرپەرشتیاری بەندیخانە دابێت. تا ئەو کاتەی لەلایەن فەرمانگەی زیندانییکردنی ئافرەتانەوە بەندیخانەیەکی ڕێک و پێکیان بۆ دروست دەکرێت، ئەمە ئەوەیە کە من بە چاکی دەزانم، بۆ ئەوەی حکوومەت خەرجی زیاتر نەکات، تکایە ڕای خۆتان و خوێندنەوەکانتان لەو بارەیەوە. لەگەڵ ڕێزدا.

بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی پاشایەتیی عێراق



32050/480

صورة كتاب مفتش سجون منطقة الموصل المؤرخ ١٩ تموز ١٩٢٤ والمرقم ١٧٥/٨ .
والمرسل لعـــــــــزة الدائـــــــرة .

..................

بعد التحية . جوابا لكتابكم المرقم ٩١٧ والمؤرخ في ٢٢/٦/١٩٢٤ .
لقد اخذت اليوم شهادة الشرطي الذي طالبه النائب العريف كاظم ( نظرالكتابي رقم
٨ س/١٤٥ تاريخ ٢٤/٦/٢٤ ) عند النظر في افادته والافادات الاخرى افتكر ان النائب
عريف كان غائبا تماما من وظيفته . مع ان الشرطة لم تشركه في السرقة فلا شك ان غيبته من الحراسة قد
ساعدت السارق . فعليه اني اقترح ان يؤدى الغرامة الخمسة روبيات عليه وان يرفت قيده من الحبس
السجن . ودمتم محترمين ؛

مطابق لاصله

## دۆسیەی پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ۱۹۲۳-۱۹٤۱ / بەڵگەنامەی ژمارە (٦)

دانەیـەک لـە نـووسراوی پشـکنەری بەندیخانەکانـی ناوچـەی موسـڵ لـە ڕێککەوتـی ۱۹ی تەممـووزی ۱۹۲٤ بـە ژمـارە ۱۷٥/۸, کـە بـۆ فەرمانگـە نێـردراوە.

---

ئەمـڕۆ شـایەتحاڵیی ئـەو پۆلیسـەم وەرگـرت، کـە کـە نائیـب عەریـف کازم داوای لێکردبـوو (بڕوانـە نـووسراوی ژمـارە ۱٤٥/۸ لـە ڕێککەوتـی ۲٤-٦-۱۹۲٤)، لـە کاتـی سـەیرکردنی شـایەتحاڵییەکانییدا، دەرکـەوت کە نائیـب عەریف بە تـەواوی لـە کارەکـەیدا ئامـادە نەبـووە، هەرچەنـدە پۆلیـس هیـچ تێوەگلانێکیـان لـە دزییەکەدا نەبـووە. بـەڵام گومانی تێـدا نییـە, کـە نەبوونـی پاسـەوان یارمەتـی دزەکـەی داوە، بۆیـە پێشـنیار دەکـەم کـە پێژماردنـی، بـە بـڕی پێنـج ڕوپیە لەسـەر هەژمـار بکرێـت و لـە پیشـەکەی لـە زینـدان دووربخرێتـەوە.

رقم ـــــــــــــ

دائرة مدير السجون المملكة العراقية

بغداد ٢٧ تموز ١٩٢٤ [illegible]

الى

فخامة وزارة الداخلية الجليلة

بغداد .

بعد التحية .

الموضوع . بيان كيفية سرقة صندوق سجن اربيل

قد قلعت نافذة غرفة مأمور سجن اربيل الكائنة في الحائط الخارج وسرق الصندوق السجن بما فيه في ليلة ٢٨ نيسان ١٩٢٤ فاحيلت المسئلة الى الشرطة فلم تتمكن الشرطة من اظهار السارق ولكن ثبت لدى الشرطة ولدى المأمور وتحقق مفتش سجون منطقة الموصل خصوصية نائب عريف محافظين سجن اربيل كاظم في تلك الليلة مع انه كان في النوبة فتسرع مأمور السجن المذكور وغرم النائب العريف كاظم خمسة روبيات جزاءً نقدياً لخصوصيته وسلمت لصندوق الحكومه . وان الاموال المسروقة هي المسرودة في ذيل هذه المذكرة وبما ان قسماً منها كان من السلفة والقسم الآخر كان من امانات المساجين فبناءً على ذلك طلبت من مفتش سجون منطقة الموصل الذي كان قد ذهب لتحقيق هذه المسئلة وتفتيش سجن اربيل بيان مطالعاته فورد لي الجواب المقدم صورته طي كتابي هذا وقد [illegible] ان تضمن الامانات فرق الغرامة المذكورة من نائب العريف المذكور ويرقن قيده .

واني ارى لحل هذه المسئلة ثلاثة ابواب (١) إما ان يجري اقتراح المفتش المذكور وبه تخسر الحكومه ثمن الصندوق فقط (٢) واما ان تضمن للمأمور وبه غضاضة لحقوق المأمور (٣) واما ان تقبل الحكومه تسويتها ذلك وتعده مصرفاً . ولذلك ارجو ارشادنا لما يستصوبه الرأي السامي . ولفخامتكم مني الشكر والاحترام سيدي الحكيم .

مقدار الاموال المسروقة .

| آنه | روبيه | |
|---|---|---|
| . | ٢٥ | ثمن صندوق السجن |
| ٣ | ١٢ | نقد من السلفة الدائمة |
| ٢ | ٤٥ | نقد من امانات المسجونين |
| . | ١٠ | قيمة ساعتين من امانات المسجونين . |
| ٥ | ٩٢ | |

مدير السجون المملكة العراقية

بغداد .

## دۆسیەی پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ١٩٢٣-١٩٤١ / بەڵگەنامەی ژمارە (٧)

فەرمانگەی بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی پاشایەتی عێراق
ژمارە: ١٠٩٧
ڕێکەوت: ٢٧ی تەمموزی ١٩٢٤

لە شەوی ٢٨ی نیسانی ١٩٢٤، پەنجەرەی ژووری سەرپەرشتیاری بەندیخانەی هەولێر لە دیوی دەرەوەدا شکێندراوە و سندوقی بەندیخانەکەش دزراوە، دۆسیەکە ڕەوانەی پۆلیس کراوە، هەرچەندە پۆلیس نەیتوانی دزەکە ئاشکرا بکات، بەڵام دوای بەدواداچوون، بۆ پۆلیس و سەرپەرشتیار و پشکنەری بەندیخانەکانی ناوچەی موسڵ ئاشکرابوو، کە نائب عەریف کازم ئەو شەوە، نۆرەی بووە و کەچی نەهاتووەتە دەوام، هەربۆیە سەرپەرشتیاری بەندیخانە، بەپەلە نائب عەریف کازمی بە پێنج ڕوپیە سزا دا بەهۆی ئامادەنەبوونی، پارەکەش ڕادەستی سندوقی حکوومەت کرا. بڕی پارە دزراوەکە، لە لیستی هاوپێچدا هاتووە، کە بەشێکی پێشینە بووە و بەشەکەی دیکەش لە ئەمانەتەکانی زیندانییان بووە. بۆیە داوا لە پشکنەری بەندیخانەکانی ناوچەی موسڵ کراوە، کە بەدواداچوون بۆ ئەم بابەتە بکات و پشکنین بۆ بەندیخانەی هەولێر بکات و پاشان ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە پێشکەش بکات، پێشنیار دەکەم کە نائیب عەریفی ناوبراو لە کارەکەی دوور بخرێتەوە.
ئێمە سێ چارەسەر بۆ ئەو بابەتە دەبینین:
(١) پشکنەری ناوبراو. پێشنیار بکات کە حکوومەت تەنها نرخی سندوقەکە لەدەست دەدات.
(٢) یان گەرەنتییکردنی سەرپەرشتیار بە زیانگەیاندن بە مافەکانی.
(٣) یان حکوومەت قبووڵی بێت، قەرەبوو بکاتەوە، خەرجییەکە بداتەوە، بۆ ئەم مەبەستە تکایە بفەرموون بۆ ڕێنمایی کردنمان.

لەگەڵ ڕێزدا

| عانە | ڕوپیە | بڕی سامانی دزراو |
|---|---|---|
| ٠ | ٢٥ | بەهای سندووقی بەندیخانە |
| ٣ | ١٢ | پارەی پێشینەی بەردەوام |
| ٢ | ٤٥ | پارەی ئەمانەتی زیندانیکراوان |
| ٠ | ١٠ | بەهای دوو کاتژمێری زیندانییان |
| ٥ | ٩٢ | |

بەڕێوەبەری گشتی بەندیخانەکانی عێراق-بەغداد



٣١ تموز/ ٩٢٤

الى مديرية السجون المملكة العراقية المحترمة

الموضوع :- سرقة صندوق سجن اربيل

بعد التحية ، جوابا عن كتابكم المرقم ١٠٩٧ والمؤرخ ٢٨ تموز سنة ١٩٢٤ .
بما ان المرقوم كاظم هو المسبب للسرقة لقد وافقنا على الفقرة الاولى من اقتراحكم القاضية بتضمينه جميع محتويات الصندوق المسروق مع ثمنه البالغة (٩٢/٥) روبية . ولكم الاحترام !

وزير الداخلية

| دۆسیەی پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ١٩٢٣-١٩٤١ / بەڵگەنامەی ژمارە (٨) |
|---|
| ٣١ی تەمموزی ١٩٢٤<br><br>بۆ بەڕێز/ بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانەکانی پاشایەتی لە عێراق<br>بابەت/ دزینی سندووقی بەندیخانەی هەولێر<br><br>پاش سڵاو<br>بۆ وەڵامی نووسراوەکەتان ژمارە ١٠٩٧ لە ڕێکەوتی ٢٨ی تەمموزی ١٩٢٤<br>دوای سڵاو، بەو پێیەی کازم هۆکارێکە بۆ دزییەکە، لەسەر بڕگەی یەکەمی پێشنیازەکەتان ڕێککەوتین، کە هەموو ناوەڕۆکی سندوقە دزراوەکە لەگەڵ بەهای (٩٢/٥) ڕوپیە بگرێتەوە.<br>لەگەڵ ڕێزدا<br><br>وەزیری ناوخۆ |



دائرة مدير السجون المملكة العراقية
العدد ٣/ ١٩٨٧
بغداد. ٢٥ تشرين الاول ١٩٢٤

الى.
مأمور سجن اربيل المحترم.

لقد تبين من تقرير المفتش المقدم لهذه الدائرة والمؤرخ في ١٣ تشرين الاول ١٩٢٤ ان قيود دفاتر التخلية مغلوطة وليست منتظمة. فعليه يقتضي ان تبذلوا الاعتناء التام لتنظيم القيود واني سوف لا اقبل اي عذر في المستقبل. اكتفي الآن بانذاركم وآملي وطيد ان يكون السجن كما يرام عند اول تفتيش يقع. هذا ما لزم ودمتم.

مدير السجون المملكة العراقية.

صورة الى.
لفخامة وزارة الداخلية الجليلة للمعلومية
حضرة مفتش سجون منطقة الموصل المحترم

## دۆسیەی پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ١٩٢٣-١٩٤١/ بەڵگەنامەی ژمارە (٩)

فەرمانگەی بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی پاشایەتی عێراقی
ژمارە: ١٩٨٧/٣
بەغداد. ٢٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٤

بۆ/ بەڕێوەبەری بەندیخانەی هەولێری بەڕێز

لە ڕاپۆرتی پشکنەری پێشەنگ سەبارەت بەو فەرمانگەیە، لە ڕێککەوتی ١٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٤ هاتووە، کە پەڕاوی تۆمارکردنتان هەڵەی زۆری تێدایە و ڕێک و پێک نییە. بۆیە داوا دەکەین کە ئاگاداری قەڵەمەکە بن بۆ ڕێکخستنی تۆمارەکان. ئێمە هیچ نارێکییەک لە داهاتوودا قبوڵ ناکەین. لە ئێستادا تەنها ئاگادارتان دەکەینەوە، هیواداریـن کە دۆخی زیندانەکە بەرەو باشی بچێت، کاتێک یەکەم پشکنین ئەنجام دەدرێت. ئەوە گرنگە و شادبن.

بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی پاشایەتی عێراقی

وێنەیەک بۆ:
جەنابی وەزیری ناوخۆی شکۆدار بۆ زانیاریتان
بەڕێز پشکنەری بەندیخانەکانی ناوچەی موسڵ



صورة تقرير مفتش العدلية عدد ٢٠٩ والمؤرخ في ٤ كانون الاول
سنة ١٩٢٤ المقدم الى وزارة العدلية .

بعد التحية والاحترام . لقد زرت السجن الملكي في لواء اربيل فوجدته عبارة
عن اثنين وعشرين محكوم بعدة مدة مختلفة وعشرة موقوفين . والسجن [illegible] لاسباب
قانونية لم اسمع شكوى من المسجونين بحق مأموري السجن . السجن محل قديم
وهو عبارة عن غرفتين وهو كل البناء مضر للصحة لانه [illegible] ومجرى الهواء فاقترح [illegible]
[illegible] بالاحجار على الاقل هذا وتفضلوا بقبول احترامي

مفتش عدلية العراق

## دۆسیەی پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ١٩٢٣-١٩٤١ / بەڵگەنامەی ژمارە (١٠)

وێنەی ڕاپۆرتی پشکنەری دادی ژمارە ٢٠٩ لە ڕێککەوتی ٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٤
کە بۆ وەزارەتی دادی ناردووە.

پاش سڵاو....

سەردانی بەندیخانەی پاشایەتییم کرد لە لیوای هەولێر، کە بیست و دوو سزادراو و دە بەندکراوی لەخۆ گرتووە. هەر هەموویان بە هۆکاری یاسایی دەستگیرکراون، هیچ سکاڵایەکی زیندانیکراوان لەلایەن سەرپەرشتیاری بەندیخانە وەرناگیرێت. بەندیخانەکەش شوێنەکەی کۆنە و لە دوو ژوور پێکهاتووە، شوێنێکی ترسناکە و مەرجی تەندروستی تێدا نییە و هەواگۆڕکێی تێدا خراپە. پێشنیار دەکەم بەلایەنی کەم شوێنەکە بەرد ڕێژ بکرێت. ڕێزی زۆرم قبوڵ بفەرموون.

پشکنەری دادیی عێراق


وزارة الداخلية العراقية
العدد ١٧٥٢٢
التاريخ ١٤ كانون الاول / ٢٤

الى مديرية السجون الملكية العراقية المحترمة

الموضوع :- حالة سجن اربيل

بعد التحية . نقدم اليكم صورة تقرير مفتش العدلية المرقم ٢٠٩ والمؤرخ ٤ كانون الاول سنة ١٩٢٤ للاطلاع عليه واتخاذ التدابير اللازمة لاصلاح حالة السجن المذكور . ولسيادتكم الاحترام .

وزير الداخلية

صورة منه مع صورة التقرير الى :-
سيادة متصرف لواء اربيل المحترم للمعلومات .

**دۆسیەی پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ١٩٢٣-١٩٤١/ بەڵگەنامەی ژمارە (١١)**

وەزارەتی ناوخۆ
ژمارە: ١٧٥٢٢
ڕێککەوتی ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٤

بۆ بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانەکانی پاشایەتی عێراق
بابەت/ بارودۆخی بەندیخانەی هەولێر

دوای سڵاو...
وەک لە سەرەوەدا هاتووە، وێنەیەک لە ڕاپۆرتی پشکنەری دادییتان بە ژمارە ٢٠٩ لە ڕێکەوتی ٤ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٤تان بۆ ڕەوانە دەکەین، بۆ زانیاری و کاری پێویست بۆ چاککردنی دۆخی بەندیخانەکە.
لەگەڵ ڕێزدا

وەزیری ناوخۆ

- وێنەیەک بۆ موتەسەریفی لیوای هەولێری بەڕێز بۆ زانیاری.



العدد ٢٦/٢٣١٤

دائرة مدير السجون المملكة العراقية

بغداد في ١٨ كانون الاول ١٩٢٤

الى

فخامة وزارة الداخلية الجليلة

بغداد

الموضوع

عدم المساعدة لانشاء سجن في اربيل

جوابا لكتابكم المؤرخ في ١٤ كانون الاول ١٩٢٤ والمرقم ١٧٥٢٢

بخصوص سجن اربيل .

لايخفاكم ان الميزانية الحالية لاتساعدنا على انشاء سجن غير السجن الموجود الآن وعلى كل سنتخذ التدابير اللازمة في السنة المقبلة . هذا ما لزم عرضه لجنابكم ودمتم باحترام سيدي ا

مدير السجون العراقية

| دۆسیەی پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ۱۹۲۳-۱۹٤۱ / بەڵگەنامەی ژمارە (۱۲) |
|---|
| ژمارە: ۲۳۱٤/۲٦<br>فەرمانگەی بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی پاشایەتی عێڕاق<br>بەغداد-۱۸ی کانوونی یەکەمی ۱۹۲٤<br><br>بۆ/ بەڕێز وەزارەتی ناوخۆی شکۆدار- بەغداد<br><br>بابەت/ نەبوونی هاوکاری بۆ دروستکردنی بەندیخانەی هەولێر<br><br>بۆ وەڵامی نووسراوتان لە ڕێککەوتی ١٤ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۲٤ بە ژمارە ۱۷۵۲۲ دەربارەی بەندیخانەی هەولێر.<br>لاتان شاراوە نییە، کە بودجەی ئێستامان هاوکار نییە بۆ دروستکردنی بەندیخانەیەکی دیکەی جیا لەم بەندیخانەی ئێستای هەولێر، بەڵام بۆ ساڵی داهاتوو هەموو هەوڵێکمان دەدەین. لەگەڵ ڕێزدا.<br><br>بەڕێوەبەری بەندیخانەکانی عێڕاق |



صورة كتاب مأمور سجن اربيل المرقم ٦/٨٢ والمؤرخ ١٧ شباط ١٩٢٥
الموجه الى المدير العام للسجون الملكية العراقية .

تحية واحتراما
في صباح اليوم المصادف ١٧ شباط ١٩٢٥ – قد توفي
في المستشفى الملكي عبد المجيد افندي الكاتب الثاني شعبة (مخمور)
الذي كان موقوف من تاريخ ١ كانون الاول ١٩٢٤ – بسبب الاختلاس
اموال الحكومة [illegible] (احدى عشر روبية) وان شهادة الطبيب
تجدون [illegible]
هذا وتفضلوا بقبول فائق الشكر والاحترام سيدي .

مأمور سجن اربيل
التوقيع
محمد [illegible]

صورة منه المرسلة الى –
متصرف لواء اربيل للمعلومات .
مدير شرطة اربيل لاجراء الايجاب .
مفتش سجون منطقة الموصل للمعلومات .

مطابق للاصل
٢٠/٢/٢٤

| **دۆسیەی پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ١٩٢٣-١٩٤١/  بەڵگەنامەی ژمارە (١٣)** |
| --- |
| وێنەیەک لە نووسراوی بەڕێوەبەری بەندیخانەی هەولێر ژمارە ٦/٨٢ لە ڕێکەوتی ١٧ی شوباتی ١٩٢٥<br>بۆ بەڕێوەبەری گشتی بەندیخانەی پاشایەتی عێراق<br>ڕێز و سڵاو<br>بەیانی ئەمڕۆ، ڕێککەوتی ١٧ی شوباتی ١٩٢٥ عەبدولمەجیدە فەندی نووسەری دووەم لە هۆبەی مەخموور لە نەخۆشخانەی پاشایەتی کۆچی دواییکرد، کە ئەم کەسە لە ڕێککەوتی ١ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٤ەوە، بەهۆی خراپبەکارهێنانی سامانی حکوومەت، لە بەندیخانە ڕاگیراوە، بڕی یازدە ڕووپیەی لە ئەستۆ دایە. گەواهینامەی پزیشکی هاوپێچ دەکەین.<br>لەگەڵ ڕێزدا<br><br>بەڕێوەبەری بەندیخانەی هەولێر<br>وێنەیەک بۆ:<br>- موتەسەریفی لیوای هەولێر.<br>- بەڕێوەبەری پۆلیس بۆ بەدواداچوون.<br>- پشکنەری بەندیخانەکانی ناوچەی موسڵ. |


العدد ٢٢/٥٠٧
دائرة المدير العام للسجون الملكية العراقية
بغداد ١٢ مارت ١٩٢٥

الى / مأمور سجن اربيل المحترم

الموضوع / الموافقة على ترميم السجن

جوابا لكتابكم المرقم ٦/٩٨ والمؤرخ في ٢ مارت سنة ١٩٢٥

مدير السجون العام

## پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ١٩٢٣-١٩٤١ / بەڵگەنامەی ژمارە (١٤)

ژمارە: ٥٠٧/٢٢
فەرمانگەی بەڕێوەبەری گشتی بەندیخانەکانی پاشایەتی عێراقی
بەغداد ١٢ی ئاداری ١٩٢٥

بۆ بەڕێوەبەری بەندیخانەی هەولێری بەڕێز
بابەت/ ڕەزامەندی لەسەر نۆژەنکردنەوەی بەندیخانە
بۆ وەڵامی نووسراوەکەتان ژمارە ٦/٩٨ لە ڕێکەوتی ٢ی ئاداری ١٩٢٥
ڕەزامەندین لەسەر خەرجکردنی سی ڕوپیە، بۆ نۆژەنکردنەوەی بەندیخانە، بۆ بیرهێنانەوە، بەبێ ڕەزامەندی وەزارەتی دارایی، ناتواندرێت گواستنەوەی ماددەکە، بۆ ماددەیەکی دیکە بکرێت، ئەم بڕە پارەیە لە ماددەی (نۆژەنکردنەوە) لە بەندیخانەی بەغداد خەرج دەکرێت، لە ماوەی ئەم مانگەدا.
بەڕێوەبەری گشتی بەندیخانەکان

وێنەیەک بۆ:
- جەنابی وەزیری ناوخۆ، بۆ زانیاری، ئاماژەدان بەو ماددانەی کە لە خشتەی هاوپێچی نووسراوماندا هاتووە، بە ژمارە ٣٦٤ لە ڕێکەوتی ٢٢ی شوباتی ١٩٢٥.
- جەنابی بەڕێوەبەری گشتی ژمێریاری، بە ئاماژەدان بە نووسراومان ژمارە ٣٦٤ لە ڕێککەوتی ٢٢ی شوباتی ١٩٢٥، تکایە ڕەچاوی ماددەی نۆژەنکردنەوەی تایبەتی بەندیخانەی بەغداد بکەن (٣٢٢٤٩) ڕوپیە لە شوێنی (٣٢٢٧٩) ڕوپیە. لە کاتێک سی ڕوپیە لەسەر هەمان ماددەی بەندیخانەی هەولێر خەرج بکرێت، دەبێتە (٧٠) ڕوپیە، لە شوێنی (٤٠) ڕوپیە.
- بەڕێز ژمێریاری لیوای هەولێر بۆ زانینتان کە کۆی گشتی ماددەی (نۆژەنکردنەوە)، دەبێتە (٧٠) ڕوپیە لە جیاتی (٤٠) ڕوپیە.
- بەڕێز بەڕێوەبەری گەنجینەی پاشایەتی بۆ زانینتان، کە کۆی گشتی ماددەی نۆژەنکردنەوەی بەندیخانەی بەغداد دەبێتە (٣٢٢٤٩) ڕوپیە.



32050/9408

الحكومة العراقية
وزارة الشؤون الاجتماعية

الشعبة: الاحصاء والرسائل
رقم الاضبارة: ٢٢/١١/٢٢
العدد: ١٦١٠
التاريخ: ١٣٦٠/٢/٢٦
١٩٤١/٣/١٤

الى مديرية السجون
بغداد.
الموضوع – تفتيش سجن اربيل.

طيه صورة تقرير المفتش الاداري في اربيل المرقم ٧ والمؤرخ في ١٩٤١/٣/١٢ حول تفتيش سجن اربيل راجين ابداء مطالعتكم حول ما جاء فيه لاسيما حول السجين المدعو رسول رستم رقم ١٩٦٨.

وزير الشؤون الاجتماعية.

صورة الى المفتش الاداري في اربيل بالاشارة الى تقريره المنوه عنه اعلاه.
صورة الى متصرفية لواء اربيل.

## دۆسیەی پشکنینی بەندیخانەی هەولێر ١٩٢٣-١٩٢٥ / بەڵگەنامەی ژمارە (١٥)

حکوومەتی عێراق
وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی
هۆبەی ئامار و نامەکان

ژمارە: ١٦١٠
ڕێککەوت: ١٩٤١/٣/١٤

بۆ بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانەکانی بەغداد
بابەت/پشکنینی بەندیخانەی هەولێر

لەگەڵ نووسراومان وێنەیەک لە ڕاپۆرتی پشکنەری کارگێڕی هەولێرتان بە ژمارە ٧ لە ڕێککەوتی ١٩٤١/٣/١٢ دەربارەی پشکنینی بەندیخانە بۆ دەنێرین، هیواداریـن خوێندنەوەتان دەست پێبکەن دەربارەی ئەوەی کە تێیدا هاتووە، بە تایبەت سەبارەت بەو زیندانییەی کە ناوی ڕەسووڵ ڕوستەمە، ژمارە ١٩٦٨.

وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی

وێنەیەک بۆ:
- پشکنەری کارگێڕی لە هەولێر بە ئاماژەدان بە ڕاپۆرتی سەرەوە.
- وێنەیەک بۆ موتەسەریفییەتی هەولێر.



32050/1673

From من متصرف لواء اربيل

G. F. 12 استمارة عمومية (١٢)

١٠٢١٦

To الى صاحب المعالي وزير المالية المفخم بغداد

No. ٣٧/١٣٦٣ نمرة

Dated the 192 التاريخ ٢٤ مايس ٩٢٤ الموافق ١٩٢

Memorandum. مذكره

تحية واحتراما

وبعد لا زلنا ننتظر ابدال مساعدتكم لدفع (٢٥٠٠٠) روبية الى بلدية اربيل و ذلك تسليمها لمباشرة توزيع الماء الى الدور قبل فوات الوقت . لان من عدم توزيعها لن يحصل اي فائدة ما . وبالعكس من توزيعها يحصل واردات وافرة . فلذا المرجو اعطا النتيجة بهذا الخصوص عاجلا . هذا ولمعاليكم مزيد الاحترام

متصرف لواء اربيل

صورة

الى صاحب المعالي وزير الداخلية المفخم

## دۆسیەی گەیاندنی ئاو بۆ شاری هەولێر ١٩٢٤-١٩٢٥/ بەڵگەنامەی ژمارە (١)

ژمارە/ ٣٧/١٣٦٣
ڕێککەوت/ ١٩٢٤/٥/٢٤
لە موتەسەڕیفی لیوای هەولێر
بۆ/ خاوەن پایە بەڕێز وەزیری دارایی/ بەغداد
ڕێز و سڵاو..

تا ئێستا چاوەڕێی هەوڵی یارمەتی و هاوکاریتانین بۆ پێدانی (٢٥٠٠٠) ڕوپیە بە شارەوانی هەولێر وەك پێشینە بۆ دەستپێکردن بە دابەشکردنی ئاو بۆ ماڵەکان، بەر لەوەی کار لەکار بترازێ، لەبەرئەوەی لە دابەشنەکردنیدا هیچ سوودێك نابینرێت، بەپێچەوانەوە لە دابەشکردنیدا داهاتێکی بەرفراوان بەدەستدێت. بۆیە تکایە بەزوویی ئەنجامێك لەم بارەیەوە بەدەستەوە بدەن. لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزم بۆ ئێوە.

ئیمزا
موتەسەڕیفی لیوای هەولێر
وێنەیەك بۆ/ خاوەن پایە بەڕێز وەزیری ناوخۆ



32050/1673

دائرة متصرف لواء اربيل
التحريرات
عــدد ٢١٠٣/ ٣٧
التاريخ ٥/آب/١٩٢٤

١٤٦٦٩
١٢/٨/٢٤

الى
صاحب المعالي وزارة الداخلية الجليلة
بغداد

الموضوع :- اعطاء المأذونية لصرف (١٢٥٠٠) روبية المعينة في اعتماد ميزانية البلدية لسنة ٢٤/٢٥ لاسالة الماء

تبجيلاً وتعظيماً.

نرفع بطيه صورة القرار المرفوعة من قبل المجلس البلدي. ما يتعلق باعطاء الامر لصرف (١٢٥٠٠) روبية الموضوعة في ميزانية البلدية للسنة الحالية لقاء تسليفات التي كانت تعطى من قبل وزارة المالية الجليلة وقدره (٢٥٠٠٠) روبية لاسالة الماء الى الدور وبما ان رغماً على المراجعات المتوالية حتى الآن لم تدفع التسليفات المذكورة لم تبق حاجة لاعطائها الى البلدية لكنه لاجل الشروع بهذا المشروع نرجو تصديق (١٢٥٠٠) روبية المنوه عنها اعلاه مع ارسال مهندساً لكي يقوم باجراء الترتيبات المقتضية فقط وذلك باسرع ما يمكن .
هــذا ولمعاليكم مــزيد الاحــترام .

متصرف لواء اربيل

## دۆسیەی گەیاندنی ئاو بۆ شاری هەولێر ١٩٢٤-١٩٢٥/ بەڵگەنامەی ژمارە (٢)

فەرمانگەی موتەسەڕیفییەتی لیوای هەولێر
نووسراوەکان
ژمارە/ ٢١٠٣/ ٣٧
ڕێککەوت/ ٥/ ئاب/ ١٩٢٤
بۆ/ خاوەن پایە وەزارەتی ناوخۆی شکۆدار/ بەغداد
بابەت/ مۆڵەتدان بە خەرجکردنی (١٢٥٠٠) ڕوپیە بۆ ڕاکێشانی ئاو، کە لە پەسندکردنی بودجەی شارەوانی ساڵی ٢٥/٢٤ ڕوونکراوەتەوە.
ڕێز و شکۆمەندی
هاوپێچ وێنەی ئەو فەرمانە بەرزدەکەینەوە، کە لەلایەن ئەنجوومەنی شارەوانی پەیوەست بە مۆڵەتدان بە خەرجکردنی (١٢٥٠٠) ڕوپیە بەرزکراوەتەوە، کە لە بودجەی ئەمساڵی شارەوانی دانراوە، ئەمەش لەبەرامبەر ئەو پێشینانەی، کە لەلایەن وەزارەتی دارایی شکۆدارەوە دەبەخشرا، کە بڕەکەی (٢٥٠٠٠) ڕوپیەیە، ئەمەش بۆ ڕاکێشانی ئاو بۆ ماڵان، وێڕای چەندین جار سەردانیکردن، بەڵام تاوەکو ئێستا ئەو پێشینانەی، کە باسکران نەدراون، تازە پێویست بەوە ناکات بە شارەوانی بدرێت، بەڵام بەمەبەستی دەستپێکردن بەم پرۆژەیە تکا دەکەین ڕەزامەندی دەربڕن لەسەر (١٢٥٠٠) ڕوپیە، کە لە سەرەوەدا ئاماژەی پێکراوە، لەگەڵ ناردنی ئەندازیارێك تا ڕێککاری پێویست بکات، ئەمەش بەزووترین کات بێت. لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزدا.

ئیمزا
موتەسەڕیفی لیوای هەولێر


32050/1673

١١٨٣٤

٧ آب سنة ٢٤

لسعادة متصرف لواء اربيل المحترم .

الموضوع :- الموافقة على مباشرة العمل بمشروع ماء اربيل .

بعد التحية .

جوابا لكتابكم المرقم ٢١٠٣ والمورخ ١٥ آب ١٩٢٤ .

نوافق على المباشرة بمشروع الماء وصرف ما هو موجود في الميزانية للسنة الحالية وقدره (١٢٥٠٠) روبية على ان يكون ذلك تحت اشراف المهندس الاجرائي للاشغال العمومية . ولسم ما الاحترام !

وزير الداخلية .

صورة مع صورة الكتاب الى :-

وزارة الاشغال الجليلة الرجاء اعطاء الامر لاعزام المهندس للاشراف على مشروع ماء اربيل .

| دۆسیەی گەیاندنی ئاو بۆ شاری هەولێر ١٩٢٤-١٩٢٥/ بەڵگەنامەی ژمارە (٣) |
| --- |
| ژمارە/ ١١٨٣٤<br>ڕێککەوت/ ٧/ ئاب/ ١٩٢٤<br>بۆ/ بەڕێز جەنابی موتەسەڕیفی لیوای هەولێر<br>بابەت/ ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر دەستپێکردنی کاری پڕۆژەی ئاوی هەولێر<br>دوای سڵاو..<br>وەك وەڵامدانەوە بۆ نووسراوتان ژمارە ٢١٠٣ لە ڕێککەوتی ١٥ی ئابی ١٩٢٤.<br>ڕەزامەندی دەردەبڕین لەسەر دەستپێکردنی پڕۆژەی ئاوی هەولێر و خەرجکردنی ئەوەی لە بودجەی ئەمساڵدا هەیە، کە بڕەکەی (١٢٥٠٠) ڕوپیەیە، پێویستە ئەمە لەژێر سەرپەرشتی ئەندازیاری ڕێککاری بۆ ئیشپێکردنی گشتی بێت. لەگەڵ ڕێزماندا.<br>وەزیری ناوخۆ<br><br>وێنەیەك لەگەڵ وێنەی نووسراوەکە بۆ/ وەزارەتی ئەشغالی شکۆدار تکایە فەرمان بکەن بە ئەندازیارەکە بۆ سەرپەرشتیکردنی پڕۆژەی ئاوی هەولێر. |

